حکومەتی هەرێمی کوردستان . عێراق
وەزارەتی رۆشنبیری ( ٨ )

# وشەو زاراوەکانی
# بابا تاهیرو
# بەراورد کردنیان لەگەڵ
# شێوەکانی زمانی کوردیدا





دکتۆر
محمد نوری عارف

١٩٩٧

# وشەو زاراوەکانی
# بابا تاهیرو
# بەراورد کردنیان لەگەڵ
# شێوەکانی زمانی کوردیدا

د. محمد نوری عارف

- ١٩٩٧ -

حکومەتی هەرێمی کوردستان- عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر
لیژنەی چاپەمەنی
ژمارە(٨)

**ناوی کتێب:** وشەو زاراوەکانی باباتاهیرو بەراورد کردنیان لەگەڵ شێوەکانی زمانی کوردیدا
**ناوی نووسەر:** د. محمد نوری عارف
**دەرهێنانی هونەری:** عوسمان پیرداود
**هەڵەچن:** جەلال زەنگابادی
**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
**چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری- هەولێر

# روون کردنەوەیەک

گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق-دەستەی کورد، بەپێی نامەی ژمارە(٣٠)، ڕۆژی ١٩٨٧/١/١٣، بڕیاری لەچاپدانی لێکۆڵینەوەی«وشــەو زاراوەکــانی باباتاهیــرو بەراوردکردنیان لەگەڵ شێوەکانی زمانی کوردیدا »دا. سەرەنجام لەبەرگی ١٦و١٧ی ١٩٨٧دا بلاویان کردەوە، بەلام چۆن بلاوکردنەوەیەک!! بەجۆرێکی ناتەواو، نزیکەی نیوەی لێکۆڵینەوەکەیان چاپ کردو لە تیپی «ش»دا قرتانیان، بێ ئەوەی پەراوێزەکانی لەکۆتاییدا چاپ بکەن، وەهەروەها بێ ئەوەی کە لەسەرەتادا بنووسن بەشی یەکەم، لەکــۆتاییدا بنووسن، مــاوێتی. ژمــارەی ئەو پــەراوێزانەی کــە لەم بەشــەدا هــاتووە لەلاپەڕە (٣٢٧-٣٧٤) بریتییە لە (٩٩) نەوەدونۆ ژمــارەی پەراوێز، بەبێ ئەوەی کــە لەکــۆتاییدا روونکرابنەوە، یان ناویان هاتبێ، بەجــۆرێ کــە هەر خــوێندەوارێکی ئاسایی بیــخوێنێتــەوە ئەزانێ کــە مەسەلەکە چییە.... لەئەنجامدا کۆڕی زانیاری دانیان بەو کردەوە نارەوایەدانا کە کردوویانەو بەڵێنیــاندا کە لەژمارەی داهاتوودا تێبینییەکی لەسەر بنووسنو بەشە چاپ نەکراوەکەو پەراوێزەکانو سەرچاوەکانی بخەنە سەر، بەلام ساڵ تەواو بوو، ژمارەیەکی تر دەرچوو، بێ ئەوەی کە بەڵێنەکەیان بەجێ بهێنن، بەشەکەی تری چاپ نەکرا.... وەکو مەبەستیــان بوو هەروا بەوجۆرە مایەوە، منیش داوای پاکنووسی لێکۆڵینەوەکەم لێ کردن، بەلام بۆیان نەگەڕاندمەوە. تەنها گۆڤارێکی تری کوردی هەبوو بۆ چاپکردنی لێکۆڵینەوەو ئەویش (ڕۆشنبیری نوێ)بوو، دانەیەکی فــۆتۆکــۆپی کــراوم بۆ نــاردن، لەئەنجــامدا ئەوانیش کــارێکی ئەوتۆیان کرد، کــێــتــر بڕیارمدا واز لە چاپدانی بهێنم، تا ئەو کاتەی کە هەلێکی لەبارم بۆ ئەرەخسێ. دوای ئەوە ئەمــینداریی گشــتی ڕۆشنبیــریو لاوان لە هەولێر بڕیاری لە چاپدانیدا، بەلام پێش ئەوەی کــە بخــرێتــە ژێرچاپ، ئەم جــارە گــوم بوو لەپاش مــاوەیەک برای بەڕێز مــامۆســتــا جــەلال زەنگابادی دۆزییــەوەو بۆی هێنامــەوە، زۆر ســوپــاسی ئەکــەم، هــیــوادارم وێنەی ئــەم جــۆرە کــەســانــە زۆربێ، بۆ خــزمــەتی نەتەوەکەمانو، هەمیشە سەرکەوتوو بێت.

ڕۆژگار هاتو ڕۆژگارچوو، دوای ئەو هەموو کردەوە نابەجــێیانەی کە بەرامبەر بەم لێکۆڵینەوەیە کرا، ئینجا شتــێکی تری بۆ داتاشرا، ئەویش ئەمــەبوو: لەڕۆژنامەی (ئاســۆ)ی ژمــارە (٥٢)ی شــەممەی ١٩٩٠/٧/٢٨دا، وتارێ لەژێر نــاونیــشـــانی:

(لەپێناوی پاراستنی شکۆمەندی ئەدەبی کوردیو بەرگرتن لە کاری نارەوا -نووسینی: «گوشاد حەمەسعید».) بڵاوکرایەوە، ئینجا لێرەدا کارەکەیان بەجۆرێکی تر هەڵگەڕاندۆتەوە، نووسەری ناوبراو وای پیشان داوە کە کاری نارەوا من کردوومە، ئەوەک (دەستەی کورد)ی گۆڤاری کۆڕ، نووسەر هاتۆتە مەیدانەوەو گوایا شکۆمەندی ئەدەبی کوردی ئەپارێزیّو بەخەیاڵی خۆی دزی گرتووەو بۆ ئەم مەبەستە وای دەرخستووە کە بەڵگەی زانستی هێناوەتەوە، و هەموو بەڵگەیەکیشی ئەوەیە کەمن ناوی هیچ سەرچاوەیەکم نەهێناوە، بەڵام ڕادەی خوێندەواری‌یەکەی ئەوەندەیە کە نازانێ ژمارەی پەراوێز چی‌یە؟!!!، (۹۹) ئەوەدو نۆجار ژمارەی پەراوێز بەژێر چاوەکانی‌دا تێپەڕ بووەو نەیزانیوە کەچین!!!!. بێجگە لەوە نیشانەکانی تری لێکۆڵینەوەکە (با.ژ.ل)ە، وەکو لەلاپەڕە (۳٤٥)ی گۆڤاری ناوبراودا بەم جۆرە هاتووە: (با.ژ.ل): لەناو کەوانەدا لەکۆتایی هۆنراوەکانی باباتاهیرەوە نوسراون بۆ ئەم مەبەستانە: با=باباتاهیر. ژ= ژمارەی چوارینەکانی باباتاهیر، کەلە: (شرح دو بیتی های باباطاهر عریان -بکوشش دکتر جواد مقصود.) وەرگیراوە. ل:لاپەڕەی هەمان سەرچاوە. کە ئەمانە لەلێکۆڵینەوەکەدا (۱٦۹)جار هاتوون، واتە (۱٦۹)جار ناوی سەرچاوەو هەمووی بەیەکەوە ئەکاتە: ۹۹+۱٦۹=۲٦۸ دووسەدو شەستو هەشت جار، کە ئەمانە ژمارەن بۆ ناوی سەرچاوە، و کەنووسەر نازانێ چینو دوای ئەو هەموو قسە ناشرینانە ئەڵێ: ناوی هیچ سەرچاوەیەکی نەهێناوە.!!

بێجگە لەوانە لە لاپەڕەی (۳٤۳)ی گۆڤارەکەدا نووسراوە: (بنچینەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر کتێبی «شرح احوال واثار دوبیتی های باباطاهر عریان -بەکوشش دکتر جواد مقصود -چاپ دوم ۱۳٥٤ خورشیدی.) دیسان لەلاپەڕەی (۳٤٤)ی گۆڤارەکەدا نووسراوە: (وەکو باس کرا بنچینەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر کتێبی: «شرح احوال واثار دوبیتی‌های باباطاهر عریان...)ە، بەڵام نووسەری ناوبراو بەوجۆرە شکۆمەندی ئەدەبی کوردی پاراستووەو بەرگرتن لەکاری نارەوا ئەکات، وەکو کورد ئەڵێ: (لەبێ خەبەران کەشکەک سەڵەوات.). سەرەنجام لەو بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەکم نووسی بۆ «ڕۆژنامەی ئاسۆ»و ئەوانیش وەکو گۆڤاری کۆڕ بەڵێنیان داو بڵاویان نەکردەوە !!! ڕۆژنامەی هاوکاریش بۆی بڵاو نەکردەوە !!! گۆڤاری کاروان ویستی بۆم بڵاو بکاتەوە، بەڵام لەڕاپەڕینەکەدا گوم بوو! وا لێرەدا چەند ڕستەیەکی وتارەکەی کاکی نووسەر (گوشاد حەمەسعید) ئەخەمە ڕوو کە ئەفەرموێ»: (ویژدان مردوو.... زۆر بۆگەن.... ڕێزی تایباتیم هەیە بۆی....

حەزلەوەناکەم زویر بێ یان بەهیچ شێوەیەک هەڵچێ چونکە هەڵچوونو دڵشکان دادنادا.... دەبێ ئەوە بزانێ هیچ عوزرو لایەنگرێکم قبووڵ نییە.... بەشێکی دیکەی ئەم لێکۆڵینەوەی لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ بڵاوکردۆتەوە.... لەهەلێکی دیکەشدا بەراوردی وتارەکەی ناو گۆڤاری رۆشنبیری نوێ دەکەین.... لەداهاتوویشدا زۆرشتی دزراوی دیکە بۆ خاوەنو سەرچاوەکانیان دەگەڕێنینەوە.)

ئەوەی کە لەگۆڤاری رۆشنبیری نوێ، لەژێر ناونیشانی: (باباتاهیری هەمەدانی)دا، بڵاوم کردۆتەوە، لێکۆڵینەوەیەکی ترەو بەشێک نییە لەم لێکۆڵینەوەیە وەکو «گوشاد» ئەڵێ. دیارە لەمەیشدا هەر ئەوەندە لێی تێگەیشتووە وەکو باسمان کرد.

بۆ دەرخستنی درۆو ڕاستی تکایە بەوردی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٨)، ساڵی ١٩٨٥، ل١٠٩-ل١٢٨ بخوێنەرەوە.

خوێنەری بەڕێز ! ... لەپاش نزیکەی (١٠)دە ساڵ هەوڵو کۆشش لەپێناوی چاپ نەکردنی ئەم بەرهەمەدا بەوجۆرەی کە باس کراو دۆزینەوەی یەکێکی وەکو «گوشاد» بۆ شێواندنو تێکدانی ڕاستیی لێکۆڵینەوەکە بەوجۆرەی کە خرایە روو. لەئەنجامدا وەزارەتی رۆشنبیری بڕیاری لەچاپ دانی داو ئێستاکە بەتەواوی لەبەر دەست دایە، داوا لە ڕەخنەگرانی بەڕێز ئەکەم، ئەو بەشەی کە بەبێ پەراوێزو سەرچاوە کۆڕی زانیاری دەستەی کورد چاپی کردووە با وشە بەوشە بەراوردی بکات لەگەڵ ئەم چاپەدا، ئینجا تا کۆتایی با هەمووی بخوێنێتەوە.

خۆ ئەگەر تەنها جۆری ئامادەکردنو نووسینی لێکۆڵینەوەکە لەژێر ناونیشانی (لێکۆڵینەوە لە وشەو زاراوەکانی باباتاهیر) بخوێنێتەوە لەهەمان چاپی کۆڕی زانیاری لەبەرگی شازدەهەمو حەڤدەهەمی ساڵی ١٩٨٧دا، لەلاپەڕە (٢٤١-٢٤٥) لەگەڵ نووسینە ناوبراوەکەی «گوشاد»دا، هەموو شتێکی بۆ ڕوونو ئاشکرا ئەبێت.

پێش ئەوەی کەبچینە ناو باسەکەوە، لەبارەی: (ژیانی باباتاهیرو سەردەمەکەیو ئەدەبی سەردەمو هاوچەرخەکانی باباو زانایانو سۆفییەکانی سەدەی پێنجەمو چوارینەکانی باباو چاپە جۆربەجۆرەکانیو دەستنووسەکانی چوارینەکانی باباتاهیر)ەوە دواوین، هەرچەندە ئەمانە پەیوەندی راستەوخۆیان نییە بەباسەکەوە، بەڵام کۆمەڵە زانیارییەکی زۆر گرنگو بەکەڵکن لەبارەی باباتاهیرەوە، بۆ رووناکبیرانو ئەدەب دۆستانو لێکۆڵەرانی کورد، کە بەم شێوەیە تائێستا لەسەرچاوە کوردییەکاندا باس نەکراوە.

گەلێ لەمێژوو نووسانو نووسەرانی کورد هەر لە ئەمیر شەرەف خانی بدلیسی‌یەوە تا ئەمڕۆ (لوڕی)یان بەیەکێ لە شێوەکانی زمانی کوردی داناوە، بەڵام ئەوەی شایانی باسە، بەشێکی زۆری ڕۆژهەڵات ناسەکانو زانا ناودارەکانی زمانە ئێرانی‌یەکانو بەشێکی زۆر لەلوڕەکان خۆیان، بەتایبەتی ڕووناکبیرەکانیان، لایان وایە کە (لوڕی) زمانێکی سەربەخۆیە، ئێمە لێرەدا کە وشەو زاراوەکانی باباتاهیرمان بەراورد کردووە لەگەڵ شێوەکانی زمانی کوردیدا، هەوڵو کۆششێکە بۆ هەنگاونانێکی زانستیانە، بۆ چوونە ناو مەیدانی ساغکردنەوەی ئەوەی کە (لوڕی) یەکێکە لەشێوەکانی زمانی کوردیو هیوادارم کە شارەزایانی زمانی کوردی لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە بنووسن.

**محمد نوری عارف**

# ژیانی باباتاهیری هەمەدانیو سەردەمەکەی

زۆربەی کەشکۆڵە بەناوبانگەکانی ڕۆژهەڵاتو ئەو سەرچاوانەی کە ژیانو بەسەرهاتی ناودارانی تیا کۆکراوەتەوەو هەروەها لەوتاری هەندێ لەڕۆژهەڵاتناسەکاندا بەکورتی یا بەشێوەی بۆچوونی تایبەتی، ناوی باباتاهیری عوریانی هەمەدانی هاتووە. بەڵام بەتەواوی نەزانراوە کە ئەم پیاو چاکە لەچ ساڵێکدا هاتۆتە جیهانەوەو، ئایا شوێنی لەدایک بوونی هەمەدانو ناوچەکانی دەوروپشتی بووە، یالەشوێنێکی تر هاتۆتە دنیاوە؟ دیسان نەزانراوە، کە سەردەمی منالّی چۆن بووەو لای چ کەسێ پەروەردە کراوەو خوێندنی سەرەتایی لەکوێو لای کێ بردۆتەسەر؟ ئایا هەر لەهەمەداندا بووە یا لەتافی لاوێتیدا هاتۆتە ئەم شارەوەو تێیدا جێگیر بووە؟ یا ئەڵوەندی کردووە بەپەناگای خۆی. لەژیانو بەسەرهاتیدا نەنووسراوە کە مامۆستای زانستی شەریعەت وە یا پێشوای تەریقەتی کێ بووە، ئەوەیشی کەبەکورتی لەکەشکۆڵو سەرچاوەکاندا بەدەست هاتووە زۆربەیان لەیەک ئەچنو لەهەندێ سەریشەوە پێچەوانەی یەکترنو هەندێ جاریش تێکەڵ بە ئەفسانەو زیادە ڕەوی بووە. بەم جۆرە هەندێ کەس ساڵی (٣٢٦) کۆچییان داناوە بۆ لەدایک بوونو ساڵی (٤١٠) کۆچییان داناوە بۆ مردنیو بەشێکی تریش ساڵانی (٣٩٠-٣٩١) کۆچییان دیاری کردووە بۆ لەدایک بوونو ساڵی (٤٥٠) کۆچی، یاچەند ساڵێ دوای ئەوەیان داناوە بۆ مردنی. هەندێ لەخاوەن کەشکۆڵەکان بابایان بەهاوچەرخی ئەبوعەلی سینا داوەتە قەڵەم کە ساڵی (٤٢٨) کۆچی مردووەو دەستەیەکی تر بەهاوچەرخی خواجە نەصیریان داناوە، کە لەساڵی (٦٧٢) کۆچیدا ئەم جیهانەی بەجێ هێشتووە.

ئەوەی کە ئاشکرایە، بابا پیرێکی بەویژدانو لەخواترسو زاناو، شارەزای زاراوەکانی صوفیگەری بووەو، بەرهەمیشی بەعەرەبیو فارسی هەیە. بەڵام ڕێبازی دەروێشیو گوێ نەدان بەخۆو پشت کردنە ئەم جیهانەو بایەخ نەدان بەهەموو خۆشییەک، شێوەی هەموو صوفییە ڕاستەکانەو ئەمەیش باباتاهیری دوور خستۆتەوە لە خۆپەرستیو بۆتە هۆی ئەوەی کە هیچ کاتێ گوێ نەداتە کاروبارو بەسەرهاتی خۆیو لەڕاستیدا ئەبێ ئەوە بزانین، کە ئەم خواناسە بالاتر لەبۆچوونی ماددیو چەنوچوونی ئاسایی ڕێگای گرتۆتە بەرو ڕادەی بیرو هۆشیشی بەرزتر

بووە لەهاوشانو دۆستەکانیو، ئەو بەرگەی کە خەڵکی هەوڵی ئەدا لەبەری بکا ئەم لەبەری خۆی دای ئەماڵیو لەبەر ئەوە بوو کە ناوبانگی دەرکرد بەعوریان. بابا هیچ کاتێ گوێی نەداوەتە خۆیو ئەوانەیشی کە پلەو پایەیەکیان داوەتێ، وازی لەوانیش هێناوە، و باشترە کە بڵێین جێگا هەڵبژێری داوێنی ئەڵوەندی هەمەدان، لەشو گیانی نەکــردووە بەمــەنزڵگای خــۆیو لەم هەردووە هاتۆتە دەرەوەو دڵی ئەوانەی کــردووە بەپەناگــایٔ خــۆی، کـــە هۆگــری جــوانیو خــۆشــەویستو ئازادانی پاک نەژادن، بەرهەمەکانی بەشێوەی سادەی لوڕی تینو جۆشو گڕوکڵپەیٔ بەرپاکردووە، لەپەناو ئەشکەوتو شـوێنی دوور دەست ژیاوەو، کـەچـی ناوبانگیـشی گـەیشـتۆتە هـەمـوو گۆشـەو کەنارێ. ئەو چوارینە سادانەی هێناوەتە بەرهەم، بەڵام وردو قـووڵو گران بەها، وتە کورتەکـانی (کلمـات قـصـار)ی نووسیـوە، بەڵام پڕواتای بڵندو پێـویست بەگەلێ لێکدانەوە، ناڵاندوویەتی بەجۆرێکی عاشقانە، خۆشەویستی دەربڕیووە بەڵام ڕاستگۆیانە، شکاتی لەستەمو دوورکەوتنەوەی یارکردووە، ئەمیشیان بەشێوەیەکی ژیرانە، باباتاهیر بەو هەمـوو پلەو گـەورەییەی کـە پـێی گـەیشـتـووە، بەدرێژایی تەمـەنی گۆشـەگیـرو تەنهاێ بووە، ئەمە بۆتە هـۆی ئەوەی، کەناوو نیـشـانێکی تەواو لەپاش خـۆی بەجێ نەهێڵی، بەڵام لەگـەڵ ئـەوەشـدا نزیکەی نۆ سـەدەیە کـە، ئاوازی دڵدارانەو، وتە کـورتە صـوفیـانەکانی، وەکو زەنگێ ئەگاتە گوێی ئەوانەی کە دڵو دەروونیان وریایە.

تائێـستـا لەمە زیاترمـان، لەبارەی ژیانو سەردەمو بەرهەمی باباتاهیـرەوە پێ نەگـــەیشـــتـــووە، بەڵام تا ئەو ڕادەی کـــە لەتوانـادا بووبێ، لەم لاو ئەولای لاپەڕەی کەشکۆڵو ئەو کتێبـانەی، کە لەبارەی ژیانو بەسـەرهاتی کەسانەوە نووسـیویانەو، هەروەها لە گۆڤارەکانیشدا، ئەوەی کە بەدەست گەیشتووە کۆکراوەتەوە.[١٠]

مـــینۆرسکی ڕۆژهـەڵاتناسـی بەناوبـانـگی ڕووسـی ئـەڵێ: بـەپـێی ئەوەی کـــە لەدەستنووسی کـتـێـبی سـەرئەنجـامو سـەرچاوەکـانی تردا هاتووە، هەندێ کـەس باباتاهیر بەهەمەدانیو بەگوێرەی هەندێ بۆچوونیتر، هەندێک بەلوڕستانی دائەنێن. کە ئەڵێن لوڕە تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەدرێتە پاڵ لوڕستان، ئەتوانین بڵێین لەسەدەی یانگزەهەمی زاینیدا کە بەهوامبەری پێنجەمی کۆچییە پەیوەندییەکی زۆر هەبووە، لەنێوان لوڕستانو هەمەدان داو، شاعیر لەم دوو شوێنەدا ژیاوە، ئێستایش لەخوڕەم ئاباد گـەڕەکێ هەیە بەناوی (بابـاتاهیــر)ەوە، هەروەهـا دوور نییە کــەهاوبەشیی بیروڕای لوڕسـتـانییەکان لەمەسـەلەی ئەهلی حـەقـقە لەگـەڵ ئەودا، بووبێـتە هۆی

ئەوەی، کەناوی خۆی بداتە پاڵ لوڕستان... زۆرجار لەچوارینەکانی‌دا ناوی لووتکەی ئەلوەند ئەبات، کە کێوێکە ئەڕوانێ بەسەر هەمەداندا. ئەوەی کەڕوونو ئاشکرایە، ئەوەیە کە باباتاهیر لەهەمەداندا ژیاوەو لەهەمەدانیشدا ئەم جیهانەی بەجێ هێشتووە، ئەوەیشی کە ژیانی بابای لەهەمەداندا ساغ کردۆتەوە، ئەوەیە کە (راوندی) لە (راحە الصدور)دا ئەیگێڕێتەوە: «بیستم کاتێ کە سوڵتان طوغرول بێگ هاتە هەمەدانەوە، سێ کەس لە وەلی‌یەکان کە باباتاهیرو باباجەعفەرو شێخ حمشا....»[2]

وشەی (بابا) لەسەرەتای ناوی باباتاهیرەوە، ناونیشانی تەریقەتی ئەوە، هەروەها بەواتای: باوکو باپیرەو ڕیش سپی‌و گەورەی خێڵو کۆمەڵو سەرۆکی قەلەندەران دێت. هەندێ کەس ئەڵێن (بابا) یەکێکە لەناونیشانە زۆر باشەکانی بەرەی بەکتاشیەو بەم هۆیەوە بابایان داناوە بەیەکێ لەصوفی‌یەکانی بەکتاشیە[3]و دووریان کردۆتەوە لە (ئەهلی حەققە). وە وشەی (عوریان) کە خراوەتە سەر کۆتایی ناوەکەیەوە، بەزۆری بەهۆی ئەوەوە بووە، کە باباتاهیر پشتی کردۆتە هەموو خۆشی‌یەکی ئەم جیهانە، یا بەدرێژایی ژیانی ڕووتەڵەبووە.

هەندێ لەکەشکۆڵ نووسەکانو ئەوانەی، لەبارەی ژیانی کەسانەوە نووسیویانە، ئەڵێن ناوی باوکی باباتاهیر (فەرەیدوون) بووە:

بوره کەز دیده جەیحوونێ بسازیم

بوره لەیلی‌یو مەجنوونی بسازیم

(فەرەیدوون)ی عەزیز ئەز دەستی مو ڕەفت

بوره ئەز نەو (فەرەیدوون)ی بسازیم

* * * *

عەزیزا مەردی ئەز نامەرد نایی

فوغانو نالە ئەز بی دەرد نایی

حەقیقەت بشنەو ئەز پووری (فەرەیدون)

کەشوعلە ئەز تەنووری سەرد نایی

* * * *

خاوەنی (الذريعة) لەبەشی دووەمی جزمی نۆهەم، لاپەڕە(٦٤٢)دا ئەڵێ: «(دیوان طاهر عريان)، وهو باباطاهر الهمداني ابن فريدون كما يظهر من شعره، قال في

(مع ١ص٣٢٦) انه كان حيا فى (٤١٠) وفى شاهد صادق انه مات فى ٤١٠....»[٤]

خوالێخۆش بوو (سەعیدی نەفیسی) لەکتێبی (تاریخ نظم ونثر در زبان فارسی، جلد اول، ص٢٢٤ ئەڵێ:

«کوڕی فەرەیدوون یەکێکە لەشاعیرەکانی کۆتایی سەدەی حەوتەمو سەرەتای سەدەی هەشتەمو لەکوردەکانی فارس بووە، هەندێ لەدوو بەیتی‌یەکانیمان پێ گەیشتووە کەبەزمانی پەهلەوی فارس دایناون»[٥].

لەکۆمەڵە دەستنووسەکەی (نورانی) لەبارەی باباتاهیرەوە ئەمە نووسراوە: تاهیری کوڕی فەرەیدوون کە ناسراوە بە باباتاهیری عوریانو دێوانەی هەمەدان... هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کە ئەم بڵندپایەیە خەڵکی دێی سیاوەشانی بەختیاری‌یەو لەنەوەی سیاوەشی کوڕی کەیکاوسە؟! هەندێکیش ئەڵێن لەبەختیاری‌یەکانی (وفس)ە، کە دێیەکە لە (سردرود)ی هەمەدان، لەبەر ئەوەی کەزۆربەی تەمەنی لەداوێنی کێوی ئەڵوەندا بەسەربردووە، ناوبانگی دەرکردووە بەدێوانەی هەمەدانو لەدەوروبەری ساڵانی چوارسەدو چەندی کۆچی‌دا ژیاوە»[٦].

دوکتۆر شەفەق ئەڵێ: باباتاهیری عوریان هەمەدانی بوو، ڕێبازی دەروێشی‌و ژیانە سادەکەی کە تایبەتی‌یە بە صۆفی‌یەکان، بۆتە هۆی ئەوەی کە بەگۆشەگیری‌و گوم ناوی تەمەنی خۆی بباتە سەرو شتێکی وامان لەبارەی ژیانی‌یەوە بۆ بەجێ نەهێڵێ، لەهەندێ کتێبی صوفی‌یەکان‌دا کورتە باسێک نووسراوە سەبارەت بەپلەو پایەو ریاضەتو دەروێشی‌و خواپەرستی‌و بێ نیازی ئەوەوە، ئەوەی کە زانراوە لەبەسەرهاتی باباوە، بەیەک گەیشتنەکەیەتی لەگەڵ طوغرولی یەکەم، پاشای سەلجووقی، لەدەوروبەری ساڵی (٤٤٧) کۆچی‌دا لەهەمەدان داو لەم دەنگو باسە ئەوەمان دەست ئەکەوێ کە سەردەمی ناوبانگی باباتاهیر ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی‌و لەوە ئەچێ کە لەدایک بوونەکەیشی کۆتایی سەدەی چوارەم بووبێ. باباتاهیر یەکێ بووە لەنووسەرو شاعیرە دڵ ورياو ئازار چەشتووەکان، ئەو ئاوازانەی کە بەڵگەی سۆزی دەروونی ئەون بەهۆنراو دەربڕیونو هەروەها چەند وردە کتێبێکیشی هەیە بەعەرەبی‌و فارسی. یەکێ لەمانە کۆمەڵێکە لەژێر ناونیشانی (کلمات قصار) بەزمانی عەرەبی، کەبیروڕای صۆفیگەری لەزانستو زانیاری‌و ذیکرو خواپەرستی‌و وەجدو خۆشەویستی، پیشان ئەدات لەڕستە کورتە

کـــاریگەرەکـــانیدا، ناوبانگی بابا بەزۆری بەهۆی دوو بەیتییە شـــیـــرینو دڵرفێنەکانێتی، تایبەتییەکانی ئەم چوارینانە ئەوەیە کە کەمێ جیاوازە لەکێشی چوارینەی ئاسایی‌و هەروەها بەزمانێ دایناوە کە لەلوڕی ئەچێ، و هەر لەبەر ئەوەیە کە لەکتێبە کۆنەکاندا بە(فەهلەویات) ناویان بردووە، لەهەموو چوارینە کاریگەرییە سادەکانیدا باسی جیهانی یەکگرتنو دووری ئادەمیزادو پەرێشانیو تەنهاییو بێ دەسەڵاتیو هەژاری خۆی کردووە، شکات لەدوورکەوتنەوەی ئەکاو جیلوەی داوە بە ئارەزووی مەعنەوی خۆی. باباتاهیر لە هەمەداندا ئەم جیهانەی بەجێ هێشتو لەهەمان شاریشدا نێژراوە«٧».

# سەرنجێک لەئەدەبی سەردەمو هاوچەرخەکانی باباتاهیر

بۆ ئەوەی باشتر پلەوپایەی باباتاهیر بناسین پێویستە کورتە سەرنجێک بدەین لەئەدەبی سەردەمی عوریانی هەمەدانیو زانایانو شاعیرانو صوفییەکانیی ئەو سەردەمەو هەروەها کەمێکیش لەپێشو لەدوای ئەوان کە لەزەمانی غەزنەوییەکانو سەلجووقییەکاندا ژیاون، لەم بارەیەوە ئەگەر بەکورتیش ناویان ببەین، زیاتر ئاگادار ئەبین لەبڵندیو مەزنی ئەم پیرە قەڵەندەرە.

ئەتوانین کۆتایی سەدەی چوارەمو هەموو سەدەی پێنجەمو شەشەمی کۆچی دابنێین بەدەوری ڕاپەڕینو بزووتنەوەی ئەدەب، چونکە زانستە جۆربەجۆرەکان بەهەموو بەشەکانییەوە زیاتر بەرەو پێشەوە ئەڕۆیشتنو زانایانو نووسەرانی بەناوبانگ لەو سەدە ناوبراوانەدا پەیدا بوون ئەم گۆڕانە گەورەیەش تا ئەندازەیێ بەهۆی ئەو دەسەڵات دارو وەزیرانەوە بوو کە خۆیشیان زانابوون، وەکو: (اسمعیل صاحب بن عباد) کە لەساڵی (٣٨٥ یا ٣٨٧)دا مردووەو (شمس المعالی قابوس بن وشمگیر) کە لەساڵی (٤٠٣) کۆچیدا کوژرا، و (بونصر مشکان)و...هتد.

لە سەردەمی غەزنەوییەکاندا و بەتایبەتی سوڵتان مەحموود (٣٨٩-٤٢١) کۆچی، زۆر ڕێز لەشاعیرو نووسەرو زانایان ئەگیراو خەڵاتیان پێشکەش ئەکرا، هەر بەو هۆیەوە بوو شاعیرانو زانایانی گەورە هەڵکەوتنو لەدەورەی سەلجووقییەکاندا، هەرچەندە زۆر بایەخ بەشاعیران نەئەدرا، بەڵام زۆر ڕێزیان لە زانایان ئەگرتو، یەکێ لەتایبەتییەکانی سەردەمی سەلجووقییەکان ئەوەبوو کە صوفیگەری پەرەی سەندو گەلێ مەشایخو صوفی هەڵکەوتن، ئەتوانین بڵێین کە درەخشان ترین دەورەی تەصەوف بوو. پاشاکانی سەلجووقی گەلێ بایەخیان بەصوفیگەری ئەدا، بەتایبەتی طوغرول، پاشای سەلجووقیو سوڵتانی بەدەسەڵات، بەرامبەر بە باباتاهیرو دوو صۆفی تر لەشکرەکەی ڕاگرتووەو بەوپەڕی ڕێزەوە لەگەڵ بابادا کەوتۆتە گفتوگۆوە«٨».

# زانایانی سەدەی پێنجەم «چەرخی بابا تاهیر»

**ئەمانە هەندێکن لەزانا کەورەکانی سەدەی پێنجەمو دەوروبەری:**

* بدیع الزمان الهمدانی ابو فضل احمد بن حسن: داهێنەری هونەری مەقامەنووسی لەساڵی ۳۹۸ کۆچیدا مردووە، کەلەگەڵ نووسەرەکانی سەردەمی خۆیو دۆستایەتی هەبووە، وەکو: (ابو حیان توحیدی)و (ابوبکری خوارزمی)و (ابوعلی مسکویە).

* ابوعبدالله فقیە معصومی: کە یەکێ بووە لە شاگردە ناسراوەکانی شێخ الرئیس ابوعلی سینا، کە لەوە ئەچێ لەساڵی (٤٢٠) کۆچیدا کوژرابێ.

* ابوعلی مسکویە احمد بن محمد: کە فەیلەسووفو پزیشکو مێژوو نووس بوو، و لەساڵی (٤٢١) کۆچیدا مردووە.

* ابو علی حسین بن عبدالله بن سینا: بلیمەتو فەیلەسووفی رۆژهەڵات(٣٧٠ کۆچی- ٤٢٨ کۆچی).

* ابو عبید جوزجانی، یەکێکە لەشاگردە تایبەتیەکانی بوعلیو تا ساڵی ٤٢٨ کۆچی زیندوو بووە.

* ثعالبی نیشابوری، ابو منصور عبدالملک بن محمد کە لەساڵی (٤٢٩) کۆچیدا مردووە.

* ابو ریحان بیرونی، محمد بن احمد (٣٦٢-٤٤٠) کۆچی.

* ابو الحسن بهمنیار یەکێ بووە لەقوتابیەکانی بوعلی سینا لەساڵی (٤٥٨) کۆچیدا مردووە.

* ابو الفضل بیهقی، لەساڵی(٤٧٠) کۆچیدا مردووە، دانەری مێژووی ال ناصرە کە سی (٣٠) جزمەو ئێستا چەند جزمێکی ناتەواوی ماوە بەناوی تاریخی مەسعوودی، ناسراو بە مێژووی بیهقی.

* ابو سعید عبد الحی بن ضحاک گردیزی، نووسەری مێژووی گەردیزی ناسراو بە (زین الاخبار).

* کوشیار گیلانی، زانای علوومی هیئتو ئەستێرەوانیو مثلثات.

* ابو الحسن نسوی، زانای زانستی حساب.

* خطیب تبریزی محمد بن عبدالله، کە لە ساڵی(٢٥٢) کۆچیدا مردووە«٩».

## (صوفی‌یەکانی سەدەی پێنجەم«سەردەمی باباتاهیر»)

* شێخ ابو علی دقاق، لە ساڵی ٤٠٦ کۆچی‌دا مردووە.
* شێخ ابو علی داستان،لە ساڵی ٤٠٧ کۆچی‌دا مردووە.
* شێخ ابو عبدالرحمن سلمی، لە ساڵی ٤١٢ کۆچی‌دا مردووە.
* ابو منصور اصفهانی،لە ساڵی ٤١٨ کۆچی‌دا مردووە.
* ابو علی سیاە، لە ساڵی ٤٢٤ کۆچی‌دا مردووە.
* ابو الحسن خرقانی، لە ساڵی ٤٢٥ کۆچی‌دا مردووە.
* حافظ ابو نعیم اصفهانی، دانەری کتێبی(حلیة الاولیاء) لە ساڵی(٤٣٠) کۆچی‌دا مردووە.
* شیخ ابو سعید ابو الخیر (٣٥٧-٤٤٠) کۆچی.
* ابو عبدالله شیرازی ناسراو بە بابا کوهی لە ساڵی (٤٤٢) کۆچی‌دا مردووە.
* شیخ ابو القاسم گرگانی، لە ساڵی (٤٥٠) کۆچی‌دا مردووە.
* ابو عثمان نیشابوری، لە ساڵی( ٤٥٧) کۆچی‌دا مردووە.
* امام ابو القاسم قشیری، دانەری رسالەی قشیریە، لە ساڵی( ٤٦٥) کۆچی‌دا مردووە.
* شیخ ابو الحسن علی، دانەری (کشف المحجوب لأرباب القلوب).
* ابو علی فارمدی، کە مامۆستای غەزالی بووە لە صوفیگەری‌دا لە ساڵی (٤٧٧) کۆچی‌دا مردووە.
* حجة الاسلام امام محمد غزالی، دانەری احیاء العلوم(٤٥٠-٥٠٥) کۆچی[١٠].

صوفی‌یەکانی سەردەمی باباتاهیر کە ئەوانیش(بابا) یان پێ ئەوتن شەش کەس بوون کە ئەمانەن:

١- باباعلی، کە لە دێی باباعلی (لەنێوان رۆژئاواو سەرووی هەمەدان)دا بووە، گۆرەکەیشی لەوێیە دێیەکەیشی بەهەمان ناو ناسراوە.

٢- باباحنجر، کە لە دێی (باباحنجر) لەبەشی میهرەبانی هەمەدان‌دا ژیاوە.

٣- باباشێ الله، لەدێی(اسفند آباد) نێژراوە، کەدوا خاکی هەمەدانەو بەشێکە

لە خاکی کوردستان.

٤- باباپەریشان، کە لە خاکی(گەروس)ـە نزیکی میهرەبانی هەمەدان نێژراو.

٥- بابارود، کە لە خاکی(مەلایر)ـەو گۆرەکەی ناسراوە.

٦- بابانظر، کە گۆرەکەی لە بەشی سەردرودی هەمەدانە، دێی(بابانظر) یش بەوەوە ناسراوە.

ئەڵێن دووبرا کە لە سەییدە ناو دارەکان بوون لەگەڵ بابادا هاوچەرخ بوونو لەدێی (باباکورکور) نێژراونو ناوی یەکێکیان(باباجمال)و ئەوی تریان (باباعلاء الدین) بووە. لەکەشکۆڵی(نورانی) یەو[11].

لێرەدا مەبەست لەناو هێنانی هەندێ لەناودارانی سەدەی پێنجەمی کۆچی ئەوەیە.تاباشتر بزانین کە باباتاهیر لە چ دەورێکی زێرینی زانستدا ژیاوەو هاوچەرخی چ زانایانێکی بەناوبانگ بووە. ئاشکرایە کە ژیانی بابا لە چەرخێکی وادا لەناو زانایانی بەناوبانگدا ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە، کەخاوەنی پلەو پایەیەکی زۆر بڵند بووەو ناوی ئەویش لەگەڵ زانایانی هەڵکەوتووی وەکو بوعلی سیناو صۆفیانی بەناوبانگی وەکو ابو القاسم قشیریدا لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو نووسراوە.

بەنرخترین بەڵگەی مەزنیی باباتاهیر چوارینەکانێتی کەبەو هۆیەوە پێشی شاعیرانونووسەرانو صوفییەکانی هاوچەرخی خۆی کەوتووە، وەکو: ( ابو سعید ابو الخیرو خواجە عبدالله انصاری)و هەروەها بەهۆی وەرگێرانی چوارینەکانی بۆ سەر زمانە بێگانەکان ناوبانگێکی تایبەتی دەرکردووە.

لەبارەی مەزنیو بەرزی ئەم صۆفییە هەمەدانییە ئەوەبەسە کە بڵێین بەوهەموو کۆششو هەوڵەی کەداویەتی بۆ ئەوەی کەناوی خۆی گوم بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەسەلاتی زانستیو بلیمەتی یەکەی وای لێ کردووە کە ناوی لەدڵی هوشیاراندا بمێنیتەوەو هیچ کاتێ لەناو ناو دارانی هاوچەرخی خۆیدا گوم نەبێ[12].

## (چوارینەکانی باباتاهیرو چاپە جۆربەجۆرەکانی)

چوارینەکانی باباتاهیر بەناونیشانی جیا جیای وەکو: چوارینە، دیوان، تەرانە، ئەشعارونەدەبیات، گەلێ جار لە ئێران‌و هەندێ ولاتانی‌تردا چاپ کراوە، لە تاران‌و شارەکانی تری ئێران‌دا چوارینە ناوبراوەکان نزیکەی(٢٩) بیست‌و نۆ جار بەوێنەی ڕەنگاوڕەنگ‌و سادەو سەنگی‌و چاپی ئاسایی بلاو کراوەتەوە.«١٣» لە لاهوورو بومبەی‌و شوێنەکانی تری هیندستان نزیکەی نۆ(٩) جار چاپ کراوە، هەروەها لە ئەستانبول دووجار چاپ کراوە، دوور نی یە لەولاتەکانی تریش‌دا چوارینەکانی باباتاهیر چاپ کرابێ، کە تائێستا ئاگامان لێ‌نیە«١٤».

بەلام بەهۆی زۆری نووسینەوەی‌و دەستکاری کردنی بەپێی ئارەزووی نووسەران‌ولەئەنجامی کاری ڕاستکاران‌و چاپکەران‌دا بەشی زۆری چوارینەکانی بەشێوەی جیا جیا چاپ کراون‌و یان وان لەسەر زمانی خەلکی «١٥».

بۆ نموونە ئەم چوارینەی خوارەوە بەهەمان ڕێنووس ئەخەینە پێش چاو کە بەجۆری جیا جیا نووسراوەتەوە، یا چاپ کراوە.

-١-

**اگر دل دلبر دلبر کدومه      اگر دلبر دله دل‌را چه نومه**
**دل‌و دلبر بهم آمیته وینم      ندونم دل که و دلبر کدومه**

«لەنووسراوە تازەکانی ئارامگای باباتاهیر»

-٢-

**اگر دل دلبری پس دل چه نامی      اگر دلبر دلی پس دل کدامی؟**
**دل و دلبر بهم آمیته دیرم      ندانم دل کەو دلبر کدامی**

«دەستنووس ئەکادیمی زانستی‌ی سۆڤیەت»

-٣-

**اگر دل دلبرو دلبر کدام است      وگر دلبر دلو دل‌را چەنام است**
**دل‌و دلبر بهم آئینه وینم      ندانم دل کەو دلبر کدام است**

«چوارینە ژمارە(٢٧) لە هەلبژاردەکانی فروغی»

-٤-

اگـر دل دلبـرو دلبـرکـدامی | وگــر دلبـر دل دلرا چه نامی
دل ودلبـر بهم آمـیـتـه دیرم | ندانم دل کــەو دلبـر کـدامی

«دەستنووسی خانمی فەرزانە»

-٥-

اگـر دل دلبـرو دلبـر کـدومـه | وگـر دلـبـر دلو دلرا چه نومـه
دل و دلبـر بهم آمـیـتـه وینم | نذونم دل کـەو دلبـر کـدومـه

«تاریخ ادبیات دکتر رضازاده شفق ص ١٠٩و
تاریخ ادبیات درایران، دکتر صفا، ج٢ ص ٣٨٢»

-٦-

اگر دل دلبر دلبرکدام است | وگر دلبر دل و دلرا چەنام است
دلو دلبر بهم آمیـتە وینم | نـذونم دل کەو دلبر کـدام است

«چوارینەی پێنجەمی دیوانی باباتاهیر
ڕاستکردنەوەی وحید دستگردی - چاپی چوارەم»

-٧-

اگر دل دلبری پس دل کـدامی | اگر دلبر دلی دلرا چەنامی
دلو دلبـر بهم آمـیـتـه وینم | ندانم دل کـەو دلبـر کـدامی

«ریاض العارفین - هدایت ص١٦٠»

-٨-

اگر دل دلبر دلبر چەنومە | وگر دلبر دله دل ازچە نومه
دلو دلبر بهم امـیته دیرم | نذونم دل کەو دلبـر کدومە

«یاددشتهای آقای قاسم برنا همدانی»«١٦»

هەروەها لەکۆمەڵە دەستنووسەکانی (نورانی)دا لەبارەی ژمارەی هۆنراوەکانی باباتاهیرەوە نووسراوە: «هۆنراوە ئاوداره‌کانی بەزمانی خۆی فەرمووە، ئەڵێن هەزارویەک (١٠٠١) دووبەیتی‌یە= چوارینەیە، کـە ناسـراوە بە چوارینەکانی باباتاهیر»«١٧».

دوکتۆر صورەتگەر لەبارەی چوارینەکانی باباتاهیرەوە ئەڵێ: دووبەیتی‌یەکانی ئەم پیاوە ئەندێشـە قووڵە ئەوەندە سادەو ڕەوانە کە هەرکەسە بەئارەزووی خۆی،

بەبێ هیچ دوودڵی‌یەک شتێکی لەخۆیەوە خستۆتە سەری‌و تێکەڵی کردووە لەگەڵ قەریحەی درەخشانی ئەوداو ئەویش کە پشتی کردۆتە ماڵی ئەم دنیایە وەکو ئەوە وایە کە سامانی بیرو هۆش‌و چێژی خۆی بەبێ درێغ هەڵڕێژتبێتە بەردەمی خەڵکی. لەبەر ئەوە جیاکردنەوەی، ئەوەی کە زادەی قەریحەی ئەوەو ئەوەی کەبەناوی ئەوەوە دانراوە زۆر سەختە«١٨».

# دەستنووسەکانی چوارینەکانی باباتاهیر

گەلێ دەستنووسی دووبەیتی‌یەکانی باباتاهیر لەکتێبخانەکانی ئاسیاو ئەوروپا، بەتایبەتی لەئێران‌و هیندستان‌دا لەگەڵ کتێب‌و نووسراوی تر، یا بەشێوەی سەربەخۆ دەست ئەکەون، کە هەریەکێ لەوانە، کۆمەڵە چوارینەیەکی باباتاهیری تێدایە کەبەشی زۆریان ساڵی نووسین‌و ناوی نووسەرەکەی لەسەر نی‌یەو لێکۆڵینەوە لەو هەموو دەستنووسانە لەوزەی ئەم پێشەکی‌یە بەدەرەو شایانی کتێبێکی سەربەخۆیە، بەڵام بەگوێرەی کورتە ئاگاداری‌یەک کە بەدەست هاتووە، هەندێ لەدەستنووسە باشەکانی چوارینەکانی باباتاهیری هەمەدانی بەپێی بایەخ پێ دانیان، ئەمانەی خوارەوەن:

١- دەستنووسی کتێبخانەی زانستگای «توبینگن»ی ئەڵمانیا **Tubingen** کەپێک هاتووە لەکۆمەڵێ لە چوارینەکانی باباتاهیرو کورتە ژیانێکی ئەو، ئەم دەستنووسە بەپێی قسەی دوکتور (اصغر کاظمی) کە دووساڵ لەزانستگای توبینگن بووە، شەست (٦٠) لاپەڕەیەو ساڵی ڕێکخستن‌و کۆکردنەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری سەردەمی باباتاهیر.

٢- بەشی پێنجەم لەو کۆمەڵەی کە پێک هاتووە لە هەشت کتێب‌و ژمارەکەی (٢٥٤٦)ـەو لەکتێبخانەی موزەی قونیە، (لەسەر گۆڕی مەولانا جلال‌الدین محمد بەلخی ناسراو بەمەلای رومی)، لەتورکیادایە، کە دوو پارچە شیعرو هەشت دوو بەیتی‌یە، بەناوی باباتاهیرەوەیەو ئەم کۆمەڵە، لەساڵی (٨٤٨) کۆچی‌دا نووسراوەتەوە.

٣- نامەی یەکەمی کۆمەڵەی ئەکادیمی زانستی سۆڤیەتی ژمارە **(A.97)**، ئەم دەستنووسە (٣٥) دووبەیتی‌یە، لەتەرانەکانی باباتاهیر، و ئەم کۆمەڵە، کە دوو کتێبە بەفەرمانی حاجی جەعفەرناوێ لەکۆتایی ربیع الثانی ساڵی (١٢٠٤)دا لەکابول نووسراوەتەوە.

٤- نامەی شەشەم لەکۆمەڵە دوانگزە بەشەکەی خانمی مەحبووبە فەرزانە کە بەهۆی عەبدوڵڵا بن ڕەمەزان عەلی هەمەدانی لەساڵی (١٢٣٠)دا بەوردی لەتاراندا نووسراوەتەوەو پێک هاتووە لە سەدوشانگزە (١١٦) چوارینەو یەک غەزەلی هەژدە (١٨) بەیتی باباتاهیر.

٥- نامەی چوارەمی کتێبی دەستنووسی ژمارە (٥١٢٤)ی کتێبخانەی مەرکەزی زانستگای تاران، لەل١٠٦- ل١٠٩، کە لەساڵی (١٢٥٤)دا نووسراوەتەوە، و چلودوو (٤٢) چوارینەی باباتاهیرە.

٦- نامەی چوارەمی دەستنووسی ژمارە (٤٢٤٣)ی کتێبخانەی زانستگای تاران. (ل١٥٩-ل١٦٢) بەخەتی نەستەعلیق لەساڵی (١٢٦٩)دا نووسراوەتەوەو، پێک هاتووە لە بیستوحەوت (٢٧) دووبەیتی باباتاهیر.

٧- نامەی چواردەهەمی کۆمەڵەی ژمارە (٤٩٤٨)ی مەجلیسی شووڕای میللی، کە چلوهەشت (٤٨) چوارینەی باباتاهیرە، و لەپەراوێزی کتێبەکە لە (ل١١٢-ل١١٦)، بەخەتی نەستەعلیقی چەلیپا، لە ربیع الأولی ساڵی (١٣٠٠) وەیا ذیقعدە الحرامی (١٣٠١)دا نووسراوەتەوە.

«فهرست مجلس شورای ملی ج١٤، ص٢٠٨».

٨- نامەی چوارەمی دەستنووسی ژمارە (٢١٩٧)ی کتێبخانەی مەرکەزی زانستگای تاران، (ل١٦٢-ل١٦٥)، بەخەتی نەستەعلیقی بیدل تەبریزی لەساڵی (١٣٠١)دا لەتاران نووسراوەتەوەو، بیستوحەوت چوارینەی باباتاهیری تێدایە.

٩- کۆمەڵە کۆکراوەکەی خوالێخۆش بوو محەمەد عەلی فروغی کەپێک هاتووە لە پەنجاویەک (٥١) چوارینەو یەک غەزەلی هەژدە (١٨) بەیتی باباتاهیری عوریانی هەمەدانی، کە لەسەرەتای سەدەی چواردەهەمی شەمسیدا کۆکراوەتەوە.

١٠- کۆمەڵە پاک نووسی ژمارە (٧٢٠)ی کتێبخانەی سەڵتەنەتی کاخی گوڵستانی تاران (ل٩٦و١١٧) کە بەخەتی شکستەی نەستەعلیقی عالی چەلیپاو موستەقیم، میرزا عەلی نەصغەر هەمەدانی لە ساڵانی (١٢١٢-١٢١٤)دا نوسیویتیەوە، و پێک هاتووە لە هەشت چوارینەی باباتاهیر.

«فهرست ناتمام کتابخانەی سلطنتی، ص٥٤٢»

دەستنووسەکانی تر:

دەستنووسەکانی تری دووبەیتییەکانی باباتاهیر، وەرگیراوە لەو یاداشتانەی کە (احمد منزوی) بۆ بەرگی سێیەمی (فهرست نسخەهای خطی فارسی) ئامادەی کردووە بۆ چاپ، کە ئەمانەن:

١١- نامەی شەشەم، کۆمەڵەی (٥١٢٥)ی کتێبخانەی میللی ملک لەتاران

ل١٠١ر-١٠٤ر) ساڵی ٩٥٧ نووسراوەتەوە.

١٢- نامەی چوارەمی کۆمەڵەی (٥٥١٤)ی کتێبخانەی ملک (ل٧٩ر-٨٢ر) لەساڵی (١٢٦٥)دا نووسراوەتەوە.

١٣- نامەی سێیەم لە کۆمەڵەی (٥٧٩) کتێبخانەی ملک (ل١١٣-١٢٠) لە ٩ی ذیقعدەی (١٢٨١)دا نووسراوەتەوە. [فهرست ملک، مجموعەها: ٨٩].

١٤- نامەی حەوتەمی کۆمەڵەی (٦٠٦) کتێبخانەی ملک (ل٨٠پ-٩٤پ) لەساڵی (١٣١٢)دا نووسراوەتەوە پێک هاتووە لە (٩٤) نەوەدوچوار دووبەیتی.

١٥- نامەی سێیەمی کۆمەڵەی (٥٥٢٦)ی کتێبخانەی ملک (ل١٣٢پ-١٦٢ر)، نووسراوی ع٢، ١٣٣٩) ئەم دەستنووسە سێسەدو بیست (٣٢٠) دووبەتی باباتاهیری تێدایە.

١٦- کەشکۆڵی ژمارە (٤٣٥١)ی کتێبخانەی مەرکەزی زانستگای تاران، کە بەشێکی لەبارەی بابا تاهیرەوەیە. [فهرست کتابخانەء مرکزی دانشگاه، ج١٢، ص٣٣٠٦].

١٧- کەشکۆڵی ژمارە (٤٤٣٠) کتێبخانەی مەرکەزی زانستگای تاران، بەشێکی لەبارەی باباتاهیری عوریانی هەمەدانیو چوارینەکانێتی لە ل١٦٩-ل١٧٤. [فهرست مرکزی، ج١٣، ص٣٣٩٠].

١٨- کەشکۆڵی ژمارە (٢٣٣٥) کتێبخانەی مەجلیسی شوورای میللی، لە ل١٤٧ تا ل١٥٢، چوارینەکانی باباتاهیری تێدایە.

[فهرست مجلس، ج٨، ص٢٤].

١٩- نامەی (٥٧) کەشکۆڵی ژمارە (٥٩٩٦) کتێبخانەی مەجلیس لە (ل١٧٦ تا ل١٨٩)، چوارینەکانی باباتاهیری تێدایە.

[فهرست مجلس، ج١٧، ص٣٧٧].

٢٠- نوسخەی ژمارە (٢ر٤٣٤٣) مەجلیسی شوورای میللی، (برگ ٦-٧).

٢١- نامەی دوانگزەهەمی کۆمەڵەی ٩٦٦ کتێبخانەی میللی تاران (ل٢٥١-٢٧٠) لەسەدەی سیانگزەهەمدا نووسراوەتەوە. [فهرست ملی، ج٢، ص٥١٦].

٢٢- نامەی شەشەمی کۆمەڵەی (١٤٨)، کتێبخانەی مەدرەسەی عالی سپە

سالار، تاران، (ل٥٠-٦٤)، لەساڵی (١٢٧٦) کۆچیدا نووسراوەتەوە. [فهرست سپهسالار ج٤، ص٥٢].

٢٣- نامەی سیوشەشەم، لەکۆمەڵەی (٢٩١٣) کتێبخانەی مەدرەسەی عالی سپهسالار، لەلاپەڕە (٥٥٣)وە. [فهرست سپهسالار، ج٥، ص٢].

٢٤- نامەی دووەم، کۆمەڵەی (١٢١) دوکتۆر مفتاح-تاران، لە ساڵی ١٢٥٨-١٢٥٩ی کۆچی نووسراوەتەوە.

٢٥- نامەی دووەم، کۆمەڵەی ژمارە (٩٣٠) کتێبخانەی رضوی مشهد، لەشعبانی ١٢٢٢دا نووسراوەتەوە.

[فهرست رضوی، ج٧، ص٧٤١].

**٢٦- نامەی دوانگزەهەم، کۆمەڵەی** (٥٧٤)، هینی حاجی عبدالحمید مەولەوی، لە **مەشهەد، لەساڵی (١٢٦٠)دا** نووسراوەتەوە، [نسخەهای خطی، نشریەء کتابخانەی **مرکزی دانشگاه تهران، ش٥، ص٩٥**].

**٢٧- دەستنووسی کتێبخانەی** میللی تەبریز، ژمارە (٢٩٠٠)، لەساڵی (١٢٨٠) **کۆچیدا نووسراوەتەوە.**

**[فهرست ملی تبریز، ج١، ص٣٦٤]**«١٩».

(٢٨، ٢٩، ٣٠) سێ دەستنووس بۆ تەواوکردنی ئەوانەی پێشەوە«٢٠».

٣١- دەستنووسی کتێبخانەی (ڤیەنا) کە لەلاپەڕەی (١٥تا٢٢)ی کۆمەڵەی ژمارە (٦٤٤)ـەو لەساڵی ١٢١٣ کۆچیدا لەلایەن لاهیجی گیلانی نووسراوەتەوە.

٣٢- دەستنووسی کتێبخانەی میللی پاریس، ژمارە (١٠٧٢) کە (١٧٤) چوارینەیە، ساڵی ١٢٦٠ کۆچی نووسراوەتەوە.

٣٣- دەستنووسێکی تری کتێبخانەی میللی پاریس، ژمارە (٢١٨٣) لەساڵی ١٢٧٢ کۆچیدا نووسراوەتەوە«٢١».

دوای ئەوە دوکتۆر جواد مقصود ئەڵێ: دەستنووسی زۆرباشی تر لە هیندستاندا هەیە، بەڵام دەستمان نەگەیشتە هیچ یەکێ لەوانە«٢٢».

## (شێوەی لوڕیو زمانی باباتاهیر)

بەشی زۆری ئەو سەرچاوانەی کە لەبارەی شێوەی زمانو زمانی باباتاهیرەوە شتێکیان نووسیوە، دانیان بەوە داناوە کە بابا لوڕ بووەو چوارینەکانی بەهەمان شێوە زمانی خۆی داناوە[٢٣]، لێرەدا بیروڕای (دارمیستەتیر)و (م.کلێمان هوار) ئەخەینە پێش چاو کە ئەڵێن، زمانی ئەڤیستا زمانی مادەکانەو (هوار) شێوەی چوارینەکانی باباتاهیر کە لوڕییە، ئەباتەوە سەر ئەڤیستا. دوای ئەوە، ئەو بیروڕایانە ئەخەینە پێش چاو (لوڕی) یان داناوە بەیەکێ لە شێوەکانی زمانی کوردیو، باسەکەیشمان کە :( وشەو زاراوەکانی بابا تاهیرو بەراورد کردنێتی لەگەڵ شێوەکانی تری کوردیدا)، ئەو ڕاستییە بەبەڵگەوە ئەسەلمێنێو لەجێگای خۆیدا دێت. ئێستا لێرەدا دێینە سەر بیروڕاکان:

دارمیستەتیرDarmesteter بۆ ئەوەی بیرو ڕاکەی خۆی ساغ بکاتەوە کە زمانی ئەڤیستا زمانی مادەکانە، بەڵگەیەک لەبارەی (فقه اللغة)وە دێنێتەوەوئەڵێ: وشەی (سەگ)لەفارسی نوێدا هەمان (سکا)یە،لەفارسی کۆندا. هیرودۆت ئەڵێ: بەزمانی مادەکان بە(سەگ) ئەڵێن (سپاکا)[٢٤] کە بەئەڤیستایی پێی ئەڵێن (سپەن)و لە سانسکریتدا (سڤەن)و لە یۆنانیدا (کوانKuon)[٢٥].

م.کلیمان هوار M.Clement Huart لەسەر بیروڕاکەی (دار میستەتیر) ئەڕواتو هەوڵ ئەدات ئەوە بسەلمێنێ کە چەند شێوەیەک لە شێوە زمانە جیا جیاکان، لەوشوێنە دوورو شاخاویەکانی ئێراندا( بەتایبەتی لە ڕۆژئاوای ئێران واتەماد)[٢٦] بەکارئەهێنرێ لەئەڤیستاوە هاتووەو بەم شێوە زمانانە ئەوترێ (مادی نوێ). (هوار) ئەڵێ: ئەوجیاوازیەی کە هەیە، ڕەگی(کەر)، لەفرمانی (کردن)ـە لەزمانی ئەڤیستایی، کەچی لە فارسیکۆندا فەرمانی (أمر)ی ئەم فرمانە(فعل)ـە، وەکو فارسی نوێ (کُن)ـە. هەروەها ڕەگی فرمانێ کە لەزمانی ئەڤیستادا بەواتای (گفتن)ـە، (واچvach و ئوچ aoj )ـە، کەچی لەفارسی کۆندا(gaub) هاتووە.(وەکو بینیمان فارسی نوێ ئەچێتەوە سەر فارسی کۆن)، لەفارسی نوێدا ئەو فرمانانەی کە بەواتای (کردن) و(گُفتن)ن، داڕشتنی فەرمانی(أمر)ی، ئەمانە(کُن)و(گوی)یە.

لەوشێوە زمانانەی کە (هوار) پێیان ئەڵێ(مادی نوێ) بنجی وشەکە(کەر)ـە لەهەموو شوێنێکدا، وەکو خۆی ماوەتەوە، لەباتی(کنم = کونەم) ئەڵێن (کەرەم)و، بەم

ئەندازەیە ئەپێورێ. ئەو وشانەی کە بەڵگەن بۆ (سخن = سوخەن)و(سوخەن گوفتەن= سخن گفتن)، لە ڕیشەی (واج)ـەوە، وەرگیراوە، یا لەبنەڕەتێکی ترەوە هاتووە، کە بەرامبەرە بە (ئوج = aoj)یا (واچ vach)ی ئەڤیستایی. (هوار)ئەم لێکۆلینەوەی بۆ دابەش کردنی شێوە زمانەکان کردووە، بەم هۆیەوە ئەوە دیاری ئەکات کە کامیان (مادی) وە کامیان (فارسی)یە، بەگوێرەی ئەم بۆچوونە زانستی‌یە، تواناو داهێنانو بۆچوونی وردی (هوار) مان بۆ دەرئەکەوێ، کەهێشتا لە ئێراندا چەندەها شێوە زمان هەیە، زمانی ئەڤیستامان پێ ئەناسێنیو لەوانەیش، شێوە زمانی چوارینەکانی بابا تاهیرە، کە سەرەتای سەدەی یانگزەی زاینی‌یە«٢٧».

دیسان(هوار) ئەڵێ: یەکێ لەو شاعیرانەی کە بەشێکی زۆری لە هۆنراوەکانی بەشێوەی تایبەتی خۆی داناوە، باباتاهیر عوریانە، کەچوارینەکانی بەشێوەی هەمەدانی، یا شێوەی لوڕی داناوە،بەڵام لەم دوو شێوەیە کامەیان بووە، گەڵێ قسەی جیا جیا لەم بارەیەوە کراوە، هەروەها(هوار) چوارینەکانی بابای لە ساڵی ١٨٨٥ زاینی‌دا لە گۆڤاری ئاسیایی Journal Asiatique لەگەڵ وەرگێرانی‌دا بۆ سەر فەرەنسی چاپ کردووە، و باباتاهیری خستۆتە ڕیزی ڕۆبیرت برنز Robert Burns (١٧٥٩تا١٧٩٦زاینی) کەیەکێ‌بوو لە شاعیرە بەناوبانگەکانی سکوتلاندە«٢٨».

دکتور خانلری ئەڵێ: لەوە ئەچێ کە زمانی کوردی بچێتەوە سەر زمانی مادی کۆن«٢٩».

ئەمیر شەرەف خانی بدلیسی، مێژوونووسی بەناوبانگی کورد، کە شەرەفنامەکەی ساڵی(١٠٠٥) کۆچی‌دا تەواوکردووە، کوردی بەگوێرەی زمانەکەی کردووە بەچوار بەشەوە: کرمانج، لوڕ، کەڵهوڕ، گۆران«٣٠».

مێژووی مەردوخ، لەباسی تیرەو هۆزەکانی کورد دا، لەبارەی بەختیاریو لوڕەوە ئەڵێ:(بەختیاری) بەشێکە لە(لوڕی گەورە)و دوو بەشن(چوارلنگ)و(هەفت لنگ).بەشی یەکەم وان لەکرماشانو ئیسفەهانو شووشتەرو زەردکووە، بەشی دووەم وان لە (بروجرد) و (گولپایگان). نزیکەی شەست هەزار خێزانو هەردوو بەشەکە سیوپێنج(٣٥) تیرەن. «بڕوانە: جغرافیای سیاسی ایران ص٧٢». هەروەها دوکتۆر (فریچ) لە کتێبی (کردلر)دا، دانی بەوەوە دانەوە کە بەختیاری‌یەکان کوردن. ڕۆژهەڵات ناسی بەناوبانگ (کیرزن) ئەڵێ: ژمارەی بەختیاری‌یەکان لە ساڵی(١٩١٨)دا (١٧٠،٠٠٠) کەس‌بوون«٣١».

(لوڕ): تیرەیەکی گەورەیە، دووبەشن، (فەیلی)و (مامەسەنی)، هەروەها بەفەیلی

ئەڵێن(لوڕی کوچک)یا (فضلویە). وە مامەسەنی واتە مام حەسەنیو لوڕی گەورەیشی پێ ئەڵێن، هەندێ کەس لوڕیان کردووە بەدوو بەشەوە (پیشکووە)و (پشتکووە). لوڕ بسیتو هەشت(٢٨) تیرەن، لوڕی (پیشکووە) و(پشتکووە) هەشتا هەزار خێزانن و بەشی زۆریان شیعەن.

یاقووتی حەمەوی لە (معجم البلدان)داو، جەودەت پاشا لە مێژووەکەی خۆیدا، لەبەرگی یەکەم لاپەڕەی (٣٤٢)و، دوکتۆر (فریج)لە(کردلر)و(سرمالکوم)و (لوریە)و (هاسل)و (براون)و (ئینسیکلوپیدیای ئیسلام) لەبارەی(لوڕ)و (بەختیاری)ـەوە، بەدرێژی نووسویانەو دانیان بەوەداناوە کە کوردن[٣٢].

مامۆستا خاڵ ئەڵێ: زمانی کوردی بەچواربەش دابەش ئەکرێ:

١- زازا.

٢- کرمانجی دەستە چەپ «شمالی»کە (بۆتانی)و (بادینانی)و (هەکاری)و (بایزیدی)و (شەمدینانی)یە.

٣- کرمانجی دەستە ڕاست کە (سۆرانی)و(بابانی)و (موکریانی)و (ئەردەڵانی)و(کەڵهوڕی)و(گۆرانی)یە.

٤- لوڕی، کە (بەختیاری)و(لەکی)و( فەیلی )یە[٣٣].

لەکتێبی (دستور جامع زبان فارسی- تالیف استاد عبدالرحیم همایونفرخ چاپ دوم- از انتشارات مطبوعات علی اکبر علمی -١٢٣٨، ص٢٩٢)دا نووسەرەکەی دانی بەوە داناوە کە (لوڕی) شێوەیەکی کوردییە، کاتێ کە لێکۆڵینەوەو پشکنینی کردووە لەوشەی (چاق)داو ئەمڕو لەفارسیدا بەواتای (قەڵەو) بەکاردێت، ئەڵێ:

بۆم دەرکەوت ئەم وشەیە لەبنەڕەتدا (کوردی لوڕی)یەو لە (چاک)ەو وەرگیراوەو ئێستایش لوڕەکان بەشێوەیەکی ئاسایی بەکاری ئەهێنن، واتە (باش = چاک).

* وەکو ئەزانین ئەمڕۆیش لای خۆمان، وشەی (چاک) هەمان واتای هەیە.(وەرگێڕ).

## (لێکۆڵینەوە لەوشەو زاراوە کانی باباتاهیر)

تائیستا گەلێ جار چوارینەکانی باباتاهیر چاپ کراوە ، لەکۆتایی زوربەی چاپەکاندا، چەند لاپەرەیەک تەرخان کراوە بۆ فەرهەنگۆکی وشەو زاراوەکانیو دانیشیان بەوەداناوە کەبابا، لور، یا لورستانی،یا بەختیاری بووەو، بەشێوەی لوری یان وەکو لوری یا ... هتد هۆنراوەکانی داناوەو ئیتر باسێک لەوەومنەکراوە، کەبەیەکێ لەشێوە زمانەکانی کوردی چوارینەکانی داناوە. ئەو کەسانەی کە دیوانی بابایان چاپ کردووە یان لەوبارەیەوە لێکۆڵینەوەیان هەیە، ئەوەیان خستۆتە پێش چاو، کەبە دریژایی ماوەی سەردەمی بابا، تائەگاتە ئەمرۆ گەلێ گۆرانو دەستکاری رووی داوە لە هۆنراوەکانی دا، هەریەکە لەوکەسانە، بەئارەزوو، و سەلیقەی خۆی، چەند وشەیەکی گۆریوەو لە جیاتیاندا وشەی فارسی داناوە، خوێنەگەر واتای چەند وشەیەکی لوری تێ نەگەیشتبێ، یان بۆی نەخوێندرابێتەوە، ئەوا خۆی چی بۆ هاتووە وچۆنی بۆ سازکراوە، وای لێ کردووە، بۆئەم مەبەستە بروانە : (باباتاهیری هەمەدانی - روشنبیری نوێ - ژمارە (١٠٨) سالی ١٩٨٥ ل ١١٨ ). لەبەرئەوە گەلێ گۆران هاتووە بەسەر چوارینەکانیدا و زۆر وشەی تایبەتی بەسەردەمی بابا تاهیرمان لەکیس چووە، تەنها رێگای بەدەست هێنانی بەشێکی زۆریان ئەوەیەکە پەنا ببەینە بەر کۆمەلێ لە باشترین دەستنووسە هەرە کۆنەکانی هۆنراوەکانی بابا و ئەو کەشکۆڵانەی کە یارمەتیمان ئەدەن بۆ ئەم کارە، ئەوانەیە کە هێشتا دەستی دەستکاری‌یان نەگەیشتۆتێ وسەدەها ساڵە لەنێوان لاپەرەکانی ئەو دەستنووسانەدا لەگۆشەو کەناری دوور دەست ولەکتێبخانەکانی ئاسیاو ئەوروپادا وەکو خۆیان ماونەتەوە،بێ گومان ئەم کارە زانستی‌یەش پێویستی بەزانایەکی شارەزایە، تابتوانێ بەشێکی زۆر لەوشەو زاراوەکانی بابا ساغ بکاتەوە، بێگومان گەلێ وشەو زاراوەیشی ئەمێنێتەوە کە ناتوانرێ وەکو چۆن بووە لەسەردەمی بابادا بەوشێوەیە بخوێنرێتەوە، چونکە نە فەرهەنگێکی لوری وامان دەست ئەکەوێ کە واتای هەموو وشەکانی بزانینو، نە بە رێنووسێ نووسراوەتەوە کە بتوانرێ بزوێنەکورتەکان یان هەموو دەنگەکان بگرێتەوە. بەلام هەرچۆنێ بێ، ئەتوانرێ بەهۆی بەراوردکردنی لەگەل ئەو هەموو شێوە زمانانەی کە کوردی هەیەتی، لەگەل ئەو هەموو زمانە زیندوو، ومردووانەی کە پێوەندی‌یان پێوە هەیە، گەلێ لایەنی تاریکو نووتک روون بکرێتەوەو پەردە لەسەر زۆر وشەو زاراوە لابدرێ، کە بەدێژایی رۆژگار، یا بەجێ

هێڵراوەو ئیتر بەکار نەهێنراوە، یان بەجۆرێکی تایبەتی بەشێوەکە گۆڕاوەو چۆتە قاڵبێکی ترەوە.ئەوەی کە شایەنی باسە ئەوەیە، کە زۆربەی زۆری ئەوانەی کە نەبارەی شێوەی زمانی باباوە نووسیویانەو بیرو ڕایخۆیان دەربڕیوە، یاهەر کوردی یان نەزانیوە، یا لەوانەیە چەند وشەیەکیان زانیبێ، ئەم کارە زانستییە وردە پڕپێچو پەنایەش بەم شێوەیە چارەسەر ناکرێونایش گاتە ئەنجامێکی تەواو.

هەرکاتێ کە چوارینەکانی بابا تاهیرم ئەخوێندەوە ، گەلێ وشەو زاراوەکانی باباتاهیرم بەر چاو ئەکەوت، کەلە شێوەکانی ئەمڕۆی کوردیدا هەن، هەندێ وشەو زاراوە نەبێ، کەئەتوانم بڵێم تایبەتین بەشێوەی لوڕیو ئەمەیش شتێکی زۆر ناساییە. ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە بمانەوێ کارێکی وابکەین، کە هەر شێوە زمانێ لەزمانەکەمان، کۆمەڵە وشەیەکی تایبەتی بەخۆی لێ دەربهێنین، بەمەرجێ لەشێوەکانی تردا نەبێ، ئەوا بەئاسانی ئەم کارە ئەکرێ، مەبەستم لێرەدا ئەمەبوو، ئەو وشەو زاراوانەی کە باباتاهیر بەکاری هێناون بەشێکیان تایبەتین بە شێوەی لوڕیو ئەوانی تریان ئەتوانین لەشێوەکانی تردا بدۆزینەوە، وبەشی زۆریان لەشێوەی کرمانجی خوارووودا هەنو هەر کۆمەڵێکی لە ناوچەیەکدا بەکار ئەهێنرێن، هەندێکیشیان لە شێوەی هەورامیدا بەکاردێنو بەشێکیشیان لە کرمانجی ژووروودا، وئەمانە لە شوێنی خۆیاندا دێن.

بنچینەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر کتێبی(شرح احوال و اثار دوبیتی های بابا طاهر عریان- بەکوششی دکتر جواد مقصود- چاپ دوم ١٣٥٤ خورشیدی)یە، کە بێجگە لە دیراسەیەکی دوورو درێژی باباتاهیر سێ سەدوشەستو پێنج (٣٦٥) چوارینەو چەند غەزەلێکی ئەویشی تێدایەو لەگەڵ چەند دەستنووسو چوارینە چاپکراوەکانی بابادا بەراوردی کردوونو دوای ئەوە فەرهەنگۆکێکی بۆ داناوە، لە ژێر ناونیشانی: (هەندێ لەوشەو زاراوەکانی دووبەیتییەکانی باباتاهیر )، لەم فەرهەنگەدا چەند وشەیەکی عەرەبی تێدابوو، لەبەر ئەوەی کەپەیوەندی بەلێکۆلینەوەکەمانەوە نەبوو، جیامان کردنەوە، چەند وشەیەک نەبێ، کەبەپێی دەستوری کوردی بەکار هاتوون وەکو: بەلایە، قەفایە، موبتەلایە ... یان وشەی(سمک = سەمەک) کەعەرەبییە، بەڵام بابا بەواتای(زەوی) بەکاری هێناوە، بەکوێرەی بیروڕای پێشینان لە کوردەواریدا ،بەبەڵگەوە ڕوونم کردۆتەوەو لەشوێنی خۆیدا پێش چاوتان ئەکەوێ.

ئەو وشانەیش کەلەزمانی کوردیو فارسیدا وەکو یەک دەرئەبڕێنو، واتایان

وەکو یەکە، ئەمە شتێکی ئاسایی‌یەو لەگەڵێ زمانی تری هیندۆ ئەورووپی‌دا بەشێکی زۆریان بەکاردێن، لەبەرئەوەی کە لە فەرهەنگۆکی وشەو زاراوەکانی بابادا نەبوون، بەراوردم نەکردن، بۆ نموونە هەندێکیان لێرەدا پیشان ئەدەم:

گول، هەرگیز، شادی، دەریا، دەست، سوود، زیان، یار، ئەگەر، دلبەر، تاریک، دەرد، دەرمـــان، دوست، دوور، ســەر، دەشت، بەهار، باغ، جـــەنگ، گــەرم، بازاڕ، گەوهەر، هیچ، تەخت، فەریاد، خەنجەر، گورگ، نامە، ڕەنگ، بار، هەزاران، خاک، میوە، پیر، تیر، درەخت، تەنگ، تەڕ، مار، لانە، چارە، کەس، دەرویش، هەمیشە، خشت، ئاواز .... هتد.

هەندێ لەوشـــەو زاراوەکـــان کـــوردی پەتین، کـــەچی لەفـــەرهەنگۆکی وشـــەو زاراوەکانی بابادا نەهاتوون، دەرم هێناونو خستوومنەتە ناو وشەو زاراوەکان، بۆ ئەوەی کە دیاربن خەتم بەژێریاندا هێناوەو، واتاکانیانم نووسیوەو نموونەی شیعریم بۆ زۆریان هێناوەتەوە، ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو وشانە:

بر، کـــر، بەرینـە، بکە، بوو، بوینـە، بوینـی، بیم، چش، ڕۆ، ڕۆچ، زانـی، زوان، سووتەنی، کەرە، لەو، نەسووتە، نەوی، نەوینەم، نەوینە، وا، وابم، وابوو، واجە، یە... هتد.

وشـــەو زاراوەکـانی بابام وەکـو خـۆی نووسـیـوەتەوەو لەدوای نیـشـانەی (=) خـسـتـوومنەتە سـەر ڕێنووسـی کـوردیو، ئەمـڕۆ چۆن ئەخـوێنرێنەوە، بەوجـۆرەم نووسـیـووەتەوەو، واتاکـانیـانم وەکـو خـۆی بەفـارسـی نووسـیـوەتەوەو تیـپی(ف)م لەکـۆتایی‌یاندا دانـاوە لەباتی وشـەی(فـارسـی)و دوای ئەوە وەرم گـێـڕاون بۆ سـەر کوردی، ئەو وشـانەی کـەلەزمـانی کـوردی‌دا واتای‌تر ئەبەخـشن، بەو واتـایانەش لێکم داونەتەوەو، ئەو وشـانەیشی کـە تا ئـەمـڕۆ گـۆڕانیـان بەسـەردا هـاتووە، لەشـوێنی خـۆیاندا ڕوونم کـردوونـەتەوە دوای ئەوە، وشـەو زاراوەکـانی بـابام بەراورد کـردووە لەگەڵ فەرهەنگە کوردی‌یەکاندا.

بۆ هـەر وشـــەو زاراوەیـەک نموونەم لەهـۆنراوەکـــانی بـابا هـێناوەتـەوە، چەند وشـەیەک نەبێ کـەلەچوارینەکـاندا، دەست نەکـەوتن هـەروەها لەغـەزەلەکـانیشدا نەبوون، وەهەندێ لە وشـەکان تەنها لەغەزەلەکاندا هەبوونو کەهـەمووی ئەکاتە چلو پێنج (٤٥) بەیت.

بەشێکی زۆرم لەوشەو زاراوەکانی بابا، لەهۆنراوەکانی شاعیرە کوردەکانماندا دۆزیەوەو بۆ هەریەکێ لەوانە بەیتێکم بەنموونە هێناوەتەوە.

وەکو باسکرا بنچینەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەرکتێبی(شرح أحوال آثار دوبیتی‌های باباطاهر عریان ....)ـەو، هەموو نموونەی هۆنراوەکانی بابام لەمەوە وەرگرتووەو لەکۆتاییاندا ناوی باباو ژمارەی چوارینەو لاپەرەکەیم بەنیشانەی (با،ژ،ل) داناوە.

بۆ وشە هەورامی‌یەکان، وەکو سەرچاوەیەک کەڵکم لە مامۆستا حەمەکەریم هەورامی وەرگرتووەو لەپاڵ ئەو وشە هەورامی‌یانەدا نیشانەی(هە)م داناوە. زۆر سوپاسی مامۆستای ناوبراو ئەکەم.

# نیشانەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە

ف :واتای وشەو زاراوەکان بەزمانی فارسی نووسراوە ، لەکۆتایی‌یاندا نیشانەی(ف)م داناوە، کەکورت کراوەی (فارسی)یە، دوای ئەوە کردوومن بەکوردی‌ولەشوێنی پێویستدا سەرنجەکانی خۆمم نووسیوە.

(با.ژ.ل) :لەناوکەوانەدا، لەکۆتایی هۆنراوەکانی باباتاهیرەوە نووسراون بۆ ئەم مەبەستانە: با = باباتاهیر. ژ = ژمارەی چوارینەکانی باباتاهیر،کەلە(شرح دوبیتی‌های باباطاهر عریان- بەکوششی دکتر جواد مقصود) وەرگیراون. ل = لاپەڕەی هەمان سەرچاوە.

پ : پەراوێزی هەمان سەرچاوە.

نخ ف : دەستنووسی دیوانی باباتاهیری(خانم فرزانە). «پەراوێزی هەمان سەرچاوە».

نو : رباعیات باباطاهر ازنسخە مجموعە چاپی ۱۲۷٤ق«پەراوێزی هەمان سەرچاوە».

هرن : رباعیات باباطاهر بتصحیح(هرن الن) بنقل ازوحید دستگردی«پەراوێزی هەمان سەرچاوە».

ش : شمارە، مەبەست ژمارەی چوارینەیە«پەراوێزی هەمان سەرچاوە».

هە : بەرامبەر بەو وشە هەورامی‌یانە نووسراوە کە لە(مامۆستا حەمە کەریم هەورامی)یەوە، وەرگیراوە.

خاڵ: فەرهەنگی خاڵ.

مەردۆخ : فەرهەنگی مەردۆخ.

مەهاباد : فەرهەنگی مەهاباد.

# وشەو زاراوەكانی باباتاهیر
# و
# بەراوردكردنیان لەگەڵ شێوەكانی زمانی كوردیدا

● اجرین = ئاجورین = ئاجەرین: آذرین(ف). ئاگرین، ئاگرین (هە). لەوە ئەچێ كە وشەی(ئاجور)، واتا خشتی سوور، ئەو خشتەی كەلە ناو ئاگردا سوور ئەكرێتەوە، لە وشەی :(ئاگر، ئایر، ئاور)ـەوە هاتبێ.

ئاجور: خشت سوور بووگ.(مەردۆخ)

**مەنم ئان(ئاجـرین) مـورغی كـە فـیلحـال**

**بسـووجـەم عـالـەمی كـەر بەرزەنەم بـال**

(با.ژ٨٧ ل ١١٩).

● انرین = ئاذەرین: اتشین(ف). ئاگرین، ئایرین(هە).

**تویی لەو شـەككەرینو باسـمین بەر**

**مـوئان تـەن(ئاذەرین)ـەم دیدەكـان تەڕ**

(با.ژ ٥٧ل١١٣).

**من ئان شـەمـعـەم كـەئەشكەم(ئاذەرین)بی**

**كـەسی كـەسـووتە دل ئەشكەش هەمـین بی**

(با.ژ٣٢٢ ل١٦٣).

● الاله = ئالالە: لالە، گل شقایق(ف). گوڵاڵە، گوڵاڵێ (هە).

**خوڕەم كووهان خوڕەم هامون خوڕەم دەشت**

**خـوڕەم ئانان كـەئین( ئالالـە)یان كـیـشت**

(با.ژ١٠ ل١٠٤).

**(ئالالە)ی خوم كەخوش ڕەنگەستو خوشبوو**

**سـەرفـرازی هەمـەـ(ئالالـە)یـان بـی**

(با.ژ ٣١٣ ل١٦١).

● الاوه و الاو= ئالاوە و ئالاو:الو وشعلەو زبانە(ف).

گڕ، گڕسەندنو هەڵگیرسان، كڵپە كردن.

ئەمڕو وشەی(هالاو) هەرچەندە بەواتای هەڵمی گەرم دیت بەزۆری،بەلام لەگەڵ وشەی(ئالاوە، ئالاو)دا یەک ئەگرنەوەو یەک ڕیشەن.

**هالاو:** تاو.ع- لهیب وهج، شرر، شراره، حراره، شواظ (مەردۆخ)ئالاو: ئالۆزکاو،هالاو(خاڵ ).

**سەحەرکاهان کە ئەشکەم لاوە کیرە**

**ز ئاهەم هەفت چەرخ(ئالاوە) کیرە**

(با.ژ.٢٤٠ ل ١٤٦).

**ز چەشمان ئان قەدەر ئەخگەر ببارەم**

**کە دنیا سەربەسەر (ئالاوە)کیری**

(با.ژ٢٤٤ ل ١٦٨).

● **اماجگە = ئاماجگە:** نشانگاه(ف).

ئاماجگە، شوێنی ئامانج، جێگای ئامانج، نیشانگا.

**دەرئین(ئاماجگە)دنیای فانی**

**یەکی ئەشکەستەتیری بی پەڕەستەم**

(با.بەیتی١ ل ١٧٥).

● **امو=** <u>ئامووں:</u> هات.

ئاما(هە).

**موسولمانان سێ دەرد(ئاموو) بەیەکبار**

**غەریبیو ئەسیریو غەمی یار**

(با.ژ.٥٠ ل١١٢).

● **امیته = ئامیته :** امیخته(ف)

تێکەڵاو. ئامێتە: شتی تێکەڵ(خاڵ). بەیتێکی فۆلکلۆری:

**ئەکەر وەبێ تۆ شایەیم وەدڵ وێ**

**یاخوا شاییەکەم(ئامێتە)ی کڵ وێ٣٤٠**

**دڵو دلبەر بەهەم(ئامیتە) وینەم**

**نەزوونەم دڵ کیو دلبەر کودامەست**

(با.ژە ل١٠٣).

مــوســـەلســـەل زولف بەر ڕووو ڕیتــە دیری

کــولو ســـونبـــول بەهەم(ئامـــیـــتـــە) دیری

(با.ژ ۳٤۳ ل۱٦۸).

● اوا = ئاوا: مـــخــفف اواز، بـانگ، ندا، وبمعنی خــواندنو طلبـیــدنو دعــا هم
ـده.(ف) کورت کراوەی ئاواز، بانگ، هاوار، واتای بانگ کردنو خواستنو دوعایش
ـەگەیەنێ.

ســەحـــەر بولبـــول زمنە(ئاوا) بـەکــولبـــون

کـــەهەرکـــە عـــەشق نەدارە مـــوردە ئەولاّ

(با.ژ۳٥ ل۱٦۹).

ز ئاهەم هەفت کـــەردوون پوڕ شـــەرەر بی

ئەگــــەر(ئاوا)کـــــەرەم خـــــوونی جگەر بی

(با.ژ ۳۰۰ ل۱٥۸).

● اوه و اوا = ئاوه و ئاوا: ابواشک چشم (ف).

ئاو وفـرمێـسـک، ،وەکو ئـەڵێن: ئاو لەچاوی هات. یا ئاو بەچاویا هاتەخـوارەوە.
ـەمڕۆ لەکوردیدا بەهەردوو واتاکەی بەکاردێت، هەروەها لەشێوەی هەورامیشدا.

ئاوی(هە)، ئاوەو چەما ئاما. واتە: ئاو لەچاوی‌هات.

زمنـەم ئـەزبـەهـەری یـاری کـــــیـــج و ویـجـی

شـــــەوانـەم(ئاوە)ئـەزچەشـــــمـــــان بریـجی

(با.ژ ۳۳۰ ل۱٦٥).

● اویته = اویخته(ف). هەڵواسراو.

ز جـــــادوونی دەرئان چاهی زمنەخــــــەدان

دلـی هـاروو‌تڕا(ئـــاویـتـــــــــــــــە)دیـری

(با.ژ ۳٤۰ ل۱٦۷).

پەریشـــــان چون کـــەری ئان تاری زولفــــان

بــە هــەر تــای دلــی(ئـاویـتــــــــــــــە)دیـری

(با.ژ۳٤۳ل۱٦۸).

● ایو = ئایوو: اید(ف). دێت.

بی تە کـولشەن بـەچەشـمـەم کـولخـەن(ئایوو)

واتە کـولخـەن بە چەشـمـەم کـولشـەن(ئایوو)

(با.ژ۲۰۷ ل۱٤۰).

● **ابی واجی = ئەبیواجی**: بیابگو(ف). بێ بڵێ. وەرە بڵێ.

**بۆ واچە(هە). واتە**:وەرە بڵێ.

**لەشێوەی لوڕیدا (ئەبی)**واتە(بێ)و لەهەورامیدا(بۆ).

**(واجی) لەلوڕیدا** واتە بڵێولەشێوەی هەورامیدا(واچە).

**تەکت مـــوشکینەکـــیـــســـو دەر قـــەفـــایە**

**(ئەبی واجی)کـــەســـەر کـــەردوون چرایە**

(با.پ ل١٥١ هرن).

● **اخگر = ئەخگر** : پاره‌ٔ آتش رخشنده(ف). پشکۆ.

**خەلیلی عەشقەحەمدی موستەعیدی سووتنە نەمرووت**

**چرا نەیویستووە ئەمما لە شوعلەی(ئەخگەر)ی زیاتر**[٣٥]

**دەر ئین ئالالە دەرکـــوویەش چو کـــولخـــەن**

**بەداغی دل چو ســووزان(ئەخگەر)ـە ســتـــەم**

(با.بەیتی٩ل١٧٥).

● **اخستان** : ئێسقان، ئێسک، ئیستیخوان.

میرزا ئولقادر ئەڵێ:

**کـــــــــــــزەی زۆخـــیو زام نـــادیـــاریمـــەن**

**قـرچەی(ئیـســتـیـخـوان) دەردەکـــاریمەن**[٣٦]

● **اشتا و = ئیشتاو**: شتاب(ف). پەلە، خێرا.

**وەرینـیتە کـــەمـــیـــهـــر ئەزمـــا ورینی**

**بەرینە روزکـــار(ئیـــشـــتـــاو)مـــەکـــە**

(با.پل ١٤٧ هرن).

● **اشمرت = ئشمورت**: شمرد(ف). ژمارد

**هەزاران داغو ریش ئەز سینەم(ئیشـمـورت)**

**هەمینە شـــمـــورتە ئەز ئشـــمـــورتە ویشی**

(با.ژ٢٤٧ ل١٦٩).

● **اشمرته = ئشمورتە**: شمرده و شمار(ف). ژمارده، ژمارە.

**هەزاران داغی ویش ئەز ویشـــەم ئشـــمـــور**

**هەنی نەشـــمـــورتە ئەز(ئشـــمـــورتە)ویشـــە**

(با.ژ٢٤٧ل١٤٨).

● افروته = ئەفرووتە: افروخته(ف). داگیرساو.

هەزاران غــــــــەم بەدل ئـەندوو تـە دیـرەم

بەســــــینە ئاتـەشی (ئەفــــرووتە) دیرەم

(با.ژ۱۱۸ ل۱۲٤).

● انبان، انبانه = ئەنبان، ئەنبانە: کیسه چرمی ازپوست دباغی‌شده(ف).

کیسەی چەرمی خۆشەکراو. واتە: هەمانە.

فــــەلەك ئەندەر دلی مــــسکین مـــوونە

ئەز ئین غــــەم هەر چ دەر(ئەنبــــانە) دیری

(با.ژ۲٤۱ ل۱٦۷).

● انداتەن = ئەنداتەن: انداختن(ف) ،هاویشتن، فڕیدان.

بەکــــــەس دەردی دلی مـــــوو واتـەنی‌نە

کــەســەنگ ئەز ئاســمــان(ئەنداتەن)ی‌نە

(با.ژ۲٥٤ ل۱٤۹).

● اندوته = ئەندووتە: اندوخته(ف). کۆکراوە.

هەزاران غــــــەم بەدل (ئـەندووتـە) دیـرەم

بەســــینە ئاتـەشی ئەفــــرووتە دیرەم

(با.ژ۱۱۸ ل۱۱۹).

نەوای نـالـەغـــــــەمی (ئـەندووتـە)دونو

عــــیــاری قـــەلبو خـــالیص بووتە دونو

(با.ژ۲۰٦ ل۱٤۰).

● او= ئەو : ئاو.

کــولی کــیـشــەتەم پەیی ئەلوەند دامـــان

(ئەو)ەش ئەز دیدە دادەم صــوبحوشـامــان

(با.ژ۱۷٦ل۱۳٤).

● اون = ئون: ان(ف). ئەوە. ئونە،یا،ئانە(هە).

مـــەن(ئون)مــسکین بی قــەدرو بەرەســتــەم

من ئان ســووزەندە شـەمـعی بی سەرەســتـەم

نەکــــاری ئاخــــیــرەت نەکـــاری دنیـــا

من (ئون) خـوشکیـدە نەخلی بی بەرەســتـەم

(با.ژ۹۲ ل۱۲۰).

